سەردەمی گوڵین - ٧
حەزرەتی
عائیشە
ڕەزای خوای لێبێت
د. عومەر یڵماز
سەردەمی
گوڵین

سەردەمی گوڵین – ٧

خۆشەویستترین دایکی بڕواداران

# حەزرەتی عائیشە

(ڕەزای خوای لێبێت)

د. عومەر یڵماز

# ناوەرۆک

هاتنەدیی خەونەکە ........................ ٨
کۆچ ........................ ١٢
ئامادەکاری بۆ کۆچ ........................ ١٥
خۆشەویستیی خانەوادەی حەزرەتی عائیشە بۆ پێغەمبەری خوا ........ ١٦
کۆچکردنی حەزرەتی عائیشە ........................ ١٩
مەدینە ........................ ٢٢
هاوسەرگیری ........................ ٢٤
شێوازی ژیانی دایە عائیشەمان: سادەیی ........................ ٢٨
ئاسۆی بەخشینی دایە عائیشە ........................ ٣٢
بایەخدانی دایە عائیشەمان بە منداڵان ........................ ٣٥
خۆشەویستی دایە عائیشە بۆ پێغەمبەری سەروەرمان ........................ ٣٦
خۆشەویستیی پێغەمبەری خوا بۆ دایە عائیشە ........................ ٣٨
خۆشی ........................ ٤١
پێشبڕکێ ........................ ٤٣
پەروەردەیەکی هەستیارانە ........................ ٤٥

نوێژی دایە عائیشەمان ........................ ٤٦
ڕۆژووی دایە عائیشە ........................ ٥٠
دایە عائیشە و حەج........................ ٥١
دایە عائیشەمان و خێرکردن (بەخشین) ........................ ٥٤
بایەخدانی دایە عائیشە بە باڵاپۆشی ........................ ٦١
بینینی چەندین ڕووداوی سەرسوورهێنەر........................ ٦٤
تەیەمووم........................ ٦٨
نەخۆشکەوتنی پێغەمبەری خۆشەویستمان........................ ٧٢
گەشتی هەمیشەیی لە ناخی دایە عائیشەمان........................ ٧٦
دایە عائیشە و زانست ........................ ٨٤
کۆچی دوایی دایە عائیشە ........................ ٨٦

# هاتنەدیی خەونەکە

پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) خەونێکی بینی، لە خەونیدا فریشتەی وەحی (حەزرەتی جوبرەئیل) کەسێکی نیشاندا. ئەوەی کە بینی حەزرەتی عائیشەی کچی حەزرەتی ئەبوبەکری نزیکترین هاوڕێی بوو. لە خەونیدا جوبرەئیل حەزرەتی عائیشەی لەناو بەرگێکی سپی لە ئاوریشم چنراودا هێنایە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) و پێی فەرموو "ئەمە خێزانی تۆیە". پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت) کاتێك بەرگەکەی لە سەری لادا، حەزرەتی عائیشەی بینی. ئیدی کاتی هاتنەدیی ئەم خەونە هاتبوو.

نزیکەی دوو ساڵ تێپەڕیبوو بەسەر کۆچی دوایی یەکەم خێزانی پێغەمبەری ئازیزمان "حەزرەتی دایە خەدیجە" (ڕەزای خوای

لێبێت). پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) لەو ماوەیەدا لەگەڵ سێ کچەکەیدا بە تەنیا دەژیا. یەکێك لە خزمەکانی بەناوی خەولە کە ئاگاداری حاڵی پێغەمبەری ئازیزمان بوو، لە پێغەمبەرمانی پرسی کە ئایا دەیەوێت هاوسەرگیری بکات؟؟ پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت) دەیویست هاوسەرگیری بکات، بەڵام تا ئەو کاتە بڕیاری نەدابوو لەگەڵ کێدا هاوسەرگیری بکات. حەزرەتی خەولە (ڕەزای خوای لێبێت) ئامادەیی خۆی نیشاندا بۆ یارمەتیدانی پێغەمبەری ئازیزمان لەم بابەتەدا. ئەو پێی وابوو شایستەترین کەس بۆ ئەوەی ببێتە هاوسەری پێغەمبەری ئازیزمان حەزرەتی عائیشەیە (ڕەزای خوای لێبێت). کاتێك خاتوو خەولە زانی کەوا پێغەمبەری ئازیزیشمان دەیەوێت خوازبێنی حەزرەتی عائیشە بکات، ڕاستەوخۆ بەرەو ماڵی حەزرەتی ئەبوبەکر بەڕێکەوت. خاتوو خەولە مژدەی دایە حەزرەتی ئەبوبەکر و ئوم ڕوممانی خێزانی ئەبوبەکر، کە پێغەمبەری خۆشەویستمان داخوازیی کچەکەیان دەکات. ئەم هەواڵە حەزرەتی ئەبوبەکر و خانەوادەکەی زۆر دڵخۆش کرد.

بەڵام چەند بابەتێك هەبوو مێشکی حەزرەتی ئەبوبەکری سەرقاڵ کردبوو، ئەو هێندەی برای خۆی هەستی بە نزیکیی پێغەمبەر دەکرد لەخۆیەوە. دەیویست بزانێت ئایا ئەم نزیکییەی لە پێغەمبەرەوە دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەم هاوسەرگیرییەدا یان نا، چونکە لە سەردەمی جاهیلیدا هاوسەرگیری لەگەڵ کچی هاوڕێی نزیکدا

به شتێکی نامۆ تەماشا دەکرا. لە لایەکی دیکەشەوە حەزرەتی ئەبوبەکر پێشتر بەڵێنی بە ماڵێکی دیکە دابوو کە داوای حەزرەتی عائیشەیان کردبوو. چارەسەرکردنی ئەم دوو کۆسپەش قورس نەبوو. سەرەتا پێغەمبەری خۆشەویستمان بۆ حەزرەتی ئەبوبەکری شیکردەوە کە لە ڕووی ئایینییەوە ئەم نزیکییەی لە حەزرەتی ئەبوبەکرەوە نابێتە ڕێگر لەبەردەم ئەم هاوسەرگیرییەدا. لە لایەکی دیکەشەوە ئەو ماڵەش کە داخوازیی حەزرەتی عائیشەیان کردبوو کەوتبوونە دوودڵییەوە، چونکە لە سەردەمی مەککەدا دروستکردنی خزمایەتی لەگەڵ کەسێکی نزیك لە پێغەمبەری ئازیزمان واتە وەستانەوە بەرامبەر هەموو ئەو ئەشکەنجانەی لەلایەن بێباوەڕەکانەوە بەرامبەریان ئەنجامدەدرا.

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بەهۆی ئەوەی خاوەنی قسەی خۆی بوو لەپێش هەموو شتێکدا چوو بۆ ئەو ماڵە

و پرسی کە ئایا لەسەر بەڵێنی خۆیان ماون یان نا؟ کە بینی ئەوان لەسەر داواکەیان نەماون بۆ داخوازیی حەزرەتی عائیشە، بە دڵێکی ئارامەوە گەڕایەوە ماڵەوە. بەمشێوەیە هیچ بەربەستێك لەبەردەم هاوسەرگیری نێوان پێغەمبەری خۆشەویستمان و حەزرەتی عائیشەدا نەمابوو. حەزرەتی عائیشە دیاری کرا کە ببێتە هاوسەری پێغەمبەرمان بەڵام هاوسەرگیرییەکە دوای کۆچی سەرەوەرمان بۆ مەدینە و لەوێ ئەنجامدرا.

# کۆچ

پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) زوو زوو سەردانی ماڵی حەزرەتی ئەبوبەکری دەکرد. دایکی حەزرەتی عائیشەش ئامۆژگاری حەزرەتی عائیشەی کردبوو کەوا زۆر بە جوانی ڕەفتار بکات و، ئەوپەڕی ڕێز لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) بگرێت. ڕۆژێکیان پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) لە کاتی نیوەڕۆدا لەناکاو هات بۆ ماڵیان، خانەوادەی حەزرەتی ئەبوبەکر سەریان لەمە سوورمابوو، چونکە پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) لە کاتی نیوەڕۆدا نەدەچووە ماڵی هیچ کەس. لەو سەردەمەدا خەڵکی بەهۆی گەرمیی کەش و هەواوە نیوەڕوان دەچوونەوە ماڵەوە و پشوویان دەدا. بەڵام ئەم جارە بارودۆخەکە جیاواز بوو، بێباوەڕەکانی مەککە پلانی کوشتنی پێغەمبەریان ئامادە

کردبوو. پێغەمبەرمان دەیویست هەم بوونی پلانێکی لەم جۆرە بە حەزرەتی ئەبوبەکر ڕابگەیەنێت، هەم هەواڵی ئەوەی پێبدات کە مۆڵەتی کۆچی لە مەککەوە بۆ مەدینە پێدراوە و دەبێت ئامادەکاری بکەن بۆ بەجێهێشتنی مەککە. سەرەتا داوای لە حەزرەتی ئەبوبەکر کرد ئەوانەی لەوێ بوون بیاننێرێتە دەرەوە. لە ژوورەوە تەنها حەزرەتی ئەسما و حەزرەتی عائیشەی (ڕەزای خوایان لێبێت) لێبوو، حەزرەتی ئەبوبەکر دەیزانی کە کچەکانی (ئەسما و عائیشە) لەو کەسانەن کە هێندە هەستیارن سەریان دادەنێن، بەڵام نهێنی بۆ کەس نادرکێنن. بۆیە بە پێغەمبەری ئازیزمانی وت "باوکم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا" ئەوان لە خانەوادەی تۆن. لەسەر ئەمە پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) ڕێگەی بە مانەوەی حەزرەتی عائیشە و ئەسمادا.

کاتێك حەزرەتی ئەبوبەکر بیستی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) مۆڵەتی پێدراوە بۆئەوەی کۆچ بکات یەکسەر پرسی:

– ئایا بەیەکەوە کۆچ دەکەین ئەی پێغەمبەری خوا؟

– بەڵێ بەیەکەوەکۆچ دەکەین.

لەڕاستیدا حەزرەتی ئەبوبەکر زۆر دەمێك بوو چاوەڕوانیی ئەم هەواڵە بوو، ئومێدی ئەوەی هەبوو کە هاوڕێی کۆچی پێغەمبەری ئازیزمان بێت. هەربۆیە دوو وشتری کڕیبوو و ئامادەی

کردبوون بۆ گەشتەکە. بیستنی ئەو هەواڵەی چەند مانگێك بوو چاوەڕێی دەکرد زۆر دڵخۆشی کرد. وەك بڵێیت ئیدی هەموو دنیا هی ئەو بێت، هێندە دڵخۆش بوو کە فرمێسك بە چاویدا دەهاتە خوارەوە.

# ئامادەکاری بۆ کۆچ

ئیدی لە ماڵی حەزرەتی ئەبوبەکردا لە باسی کۆچ زیاتر باسی هیچ شتێکی دیکە نەدەکرا. حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) لەگەڵ خوشکەکەی و دایکیدا دەستیان کرد بە ئامادەکاریی پێداویستییەکانی ئەو کۆچە. سەرەتا حەزرەتی ئەبوبەکر و پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت) ڕێککەوتن لە درەنگانێکی شەودا لە شوێنێکی دیاریکراودا یەکدی ببینن. لەوێوە بەرەو چیای سەور بەرێبکەون و لەناو ئەشکەوتێکدا بۆ ماوەیەك خۆیان حەشار بدەن و پاشان بەڕێ بکەون بۆ مەدینە. بۆ تێکدانی پیلانی بێباوەڕان و خافڵاندنیان، پێغەمبەرمان حەزرەتی عەلی لە جێگەی نوستنەکەی خۆیدا بەجێهێشت. حەزرەتی ئەبوبەکریش لە یەکێك لە پەنجەرەکانی ماڵەکەیەوە بەوریایی خۆی هەڵدا و خۆی گەیاندە پێغەمبەری خۆشەویست، پاشان پێکەوە بەڕێکەوتن بەرەو چیای سەور.

# خۆشەویستیی خانەوادەی حەزرەتی عائیشە بۆ پێغەمبەری خوا

خۆشەویستیی پێغەمبەر لەو ماڵەدا کە حەزرەتی عائیشەی تێدا پەروەردە بووبوو لەپێش خۆشەویستیی هەموو کەسێکی ترەوە بوو. یەکێك لە جوانترین نموونەکان بۆ ئەم خۆشەویستییە لە حەزرەتی ئەبوبەکردا دەبینین کاتێك لەناو ئەشکەوتەکەی چیای سەوردا لەگەڵ پێغەمبەردا خۆیان حەشاردابوو. ئەوە بوو هەرکە چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە، حەزرەتی ئەبوبەکر جلەکانی دڕی و دەستی کرد بە گرتنی کون و کەلەبەری ناو ئەشکەوتەکە، تا ببێتە ڕێگر لەبەردەم هاتنە ژوورەوەی مار و مێرووودا. بەڵام جلەکانی بەشی گرتنی هەموو کونەکانی نەکرد. بۆیە حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت)

یەکێك لەو کونانەی کە مابوو، بە پاژنەی پێی گرتی. بەڵام مارێك لەو کونەوە قاچی دەگەزێت و ئاگر لە گیانی بەردەدات. سەرەڕای ئەمە حەزرەتی ئەبوبەکر دانی بە خۆدا گرت، نەجووڵا و دەنگی لێوە نەهات. چونکە پێغەمبەری خۆشەویستمان لەسەر ئەژنۆی نوستبوو، نەیدەویست ئاسوودەیی پێغەمبەرمان تێکبدات و بەخەبەری بهێنێت، هیچ دەنگی لێوە نەهات. بەڵام بەهۆی ئەو ئازارەوە کە چەشتی فرمێسکەکانی کەوتە سەر ڕوومەتی پێغەمبەری ئازیزمان و بەخەبەری هێنا.

پێغەمبەری خۆشەویستمان پرسی:

– چیت لێ هاتووە ئەی ئەبوبەکر؟

– دایك و باوکم بە فیدات بن، ئەی نێردراوی خوا، مار گەستمی. کاتێك سەروەرمان بەمەی زانی، تفی پیرۆزی خۆی دا لەو شوێنەی مارەکە گەستبووی. بەمەش پاژنەی حەزرەتی ئەبوبەکر چاك بوویەوە وەك ئەوەی هیچی لێ نەهاتبێت.

پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) لەو ئەشکەوتەدا وەفاداری تەنها لە حەزرەتی ئەبوبەکرەوە نەبینی. بەڵکو وەفاداری ئەو کۆترەشی بینی کە کاتێك هەواڵی هاتنی سوڵتانی پێغەمبەران دەبیستێت بۆ ئەشکەوتەکە، یەکسەر دەدات لە شەقەی باڵ و خۆی دەگەیەنێتە ئەوێ. بە دروستکردنی هێلانە و هێلکەکردن

ئەرکی چەواشەکردنی بێباوەڕان و پاراستنی پێغەمبەری ئازیزمان دەگرێتە ئەستۆ. لە دەروازەی ئەشکەوتەکەدا، جاڵجاڵۆکەکەش بە دروستکردنی تۆڕی جاڵجاڵۆکە دەیویست هەوڵی خۆی نیشان بدات لە بەلاڕێدابردنی بێباوەڕان و پاراستنی سەروەرمان (دروودی خوای لێبێت) لە مەترسییەکان.

# کۆچکردنی حەزرەتی عائیشە

چەند مانگێك تێپەڕیبوو بەسەر کۆچی سەروەرمان و حەزرەتی ئەبوبەکر بۆ مەدینە. بەڵام حەزرەتی عائیشە هیچ هەواڵێکی لە پێغەمبەرمان و باوکییەوە پێنەگەیشتبوو، بێچارە لە چاوەڕوانیدا بوو. ڕۆژێکیان بینی برا گەورەکەی (حەزرەتی عەبدوڵڵا) بە دڵخۆشییەوە هاتەوە بۆ لای. کاتێك حەزرەتی عائیشە تێگەیشت کە براکەی بۆچی دڵخۆش بووە، ئەویش بە بیستنی هەواڵەکە زۆر دڵخۆش بوو. هەواڵەکەش گەیشتنی نامەیەك بوو لە حەزرەتی ئەبوبەکرەوە بۆ عەبدوڵڵای کوڕی. حەزرەتی ئەبوبەکر لە نامەکەدا داوای کردبوو لە عەبدوڵڵا کە لەگەڵ دایکی و هەردوو خوشکەکەی (ئەسما و عائیشە) بەرەو مەدینە بەڕێ بکەون. ئیتر کاتی شادبوونەوەی حەزرەتی عائیشە بە باوکی خۆشەویستی و پێغەمبەری ئازیزمان هاتبوو.

حەزرەتی عائیشە لە کۆچەکەیدا ڕووبەڕووی تەنگوچەڵەمەی زۆر بوویەوە، لەناکاو ئەو حوشترەی کە دایکمان عائیشە لەسەری بوو لە قافڵەکە جیابوویەوە و هەتا دەهات دووردەکەوتەوە. دایکی حەزرەتی عائیشە لە بەرامبەر ئەم ڕووداوەدا زۆر پەشۆکا. چونکە ڕێبواری سەر حوشترەکە سپاردەی پێغەمبەرمان بوو. پێویست بوو ئەو سپاردەیە بێ ئەوەی هیچ زیانێکی پێبگات بگەیەنرێتە دەستی خاوەنەکەی. بۆیە دایکی حەزرەتی عائیشە لە شڵەژاویدا هاواری دەکرد و دەیوت "وای چی بەسەر کچەکەمدا هات!". دوای ئەوەی حوشترەکە هەر بەردەوام بوو لەدوورکەوتنەوەی لە قافڵەکە، دایکی عائیشە وەك کۆتا چارە هاواری کرد و وتی "عائیشە لغاوی حوشترەکە فڕێبدە سەر زەوی."

ئەمەی بە ئومێدی ئەوە وت کە بەڵکو لغاوەکە لە دڕکوداڵی ناو دەوەنەکە گیرببێت تا حوشترەکە پێی بوەستێتەوە. حەزرەتی

عائیشەش بەگوێی دایکی کرد و لغاوەکەی بەردایە سەر زەوی. زۆری پێنەچوو لغاوەکە لە دڕکوداڵی دەوەنەکە گیربوو، وە بووە ڕێگر لەبەردەم دوورکەوتنەوەی حوشترەکە. بەمشێوەیە حەزرەتی عائیشە و دایکی بەیەکگەیشتنەوە و هەناسەیەکی ئارامیان هەڵکێشا.

# مەدینە

حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) لەدوای سەفەرێکی سەخت گەیشتە مەدینە. بەمشێوەیە ئەو حەسرەتەی چەند مانگێکی خایاند کۆتایی پێهات. ڕۆژانی ناڕەحەت و سەختی مەککە لە ڕابردوودا مانەوە. بەڵام لە مەدینەدا ناڕەحەتییەك چاوەڕێی دەکرد کە زۆر سەخت بوو. حەزرەتی ئەبوبەکری باوکی لەگەڵ کۆمەڵێکی دی لە هاوەڵاندا کە بە کەشوهەوای مەدینە ڕانەهاتبوون تووشی نەخۆشی و تا بووبوون.

حەزرەتی عائیشە لە باوکی نزیك دەبێتەوە و لێی دەپرسێت:

– باوکە گیان حاڵت چۆنە؟ هەست بەچی دەکەیت؟

بەڵام ئەو وەڵامەی کە حەزرەتی عائیشە وەریگرتەوە هێندەی تر ناڕەحەتییەکەی زۆرکرد.

– خەڵکی هەموو لە ماڵی خۆیدا بە ڕۆژێکی نوێ شاد دەبێتەوە، بەڵام مردن لە مرۆڤەکانەوە لە پەتی پێڵاوەکانیان زۆر نزیکترە.

حاڵی ئەو نەخۆشانەی تریش کە لە تەنیشت حەزرەتی ئەبوبەکرەوە بوون لەو باشتر نەبوون. حەزرەتی عائیشە کە ئەم حاڵەی بینی یەکسەر چووە لای پێغەمبەرمان و وتی:

– ئەوان بەهۆی تای نەخۆشییەکەیانەوە وا دیارە ئاگایان لە خۆیان نەبێت، لەبەر خۆیانەوە قسەدەکەن.

ئەم دۆخە کە حەزرەتی ئەبوبەکریشی تێدابوو. لەناخەوە پێغەمبەری خۆشەویستمانی بریندارکردبوو.

ئەوەبوو پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت) دەستە پیرۆزەکانی بەرزکردەوە و بەمشێوەیە نزای کرد:

– خوایەگیان چۆن مەککەت لامان خۆشەویست کرد، مەدینەشمان لا خۆشەویست بکە. ئێرە بکە بە شوێنێکی تەندروست. کێشانە و پێوانەکەی بەرەکەتدار بکە. ئەم نەخۆشییە لێرە هەڵبگرە و دووری بخەرەوە بۆ شوێنێکی دی.

ئەم نزایەی پێغەمبەری خۆشەویستمان قبووڵ بوو. زۆری پێنەچوو باوکی حەزرەتی عائیشە و هەموو ئەوانەی تریش لەم نەخۆشییە چاکبوونەوە و ڕزگاریان بوو.

# هاوسەرگیری

پێغەمبەری خۆشەویستمان کاتێك هاتە مەدینە وەك میوان لە ماڵی "ئەبو ئەیوبی ئەنصاری"دا مایەوە. کاتێك حەزرەتی عائیشە هاتە مەدینە بەهۆی ئەوەی هێشتا لەگەڵ پێغەمبەرماندا دەستگیراندار بوو، بۆیە لە ماڵی باوکیدا مایەوە. زۆری پێنەچوو حەزرەتی جوبرەئیلی فریشتەی وەحی فەرمانی هاوسەرگیری حەزرەتی عائیشەی بۆ پێغەمبەرمان هێنا. پێغەمبەری خۆشەویستمان دەیویست کە هاوسەرگیری لەگەڵ حەزرەتی عائیشەدا بکات، بەڵام خاوەنی هیچ سامانێك نەبوو تا لە جێی مارەیی بیدات. لێرەشدا مەردایەتی و جوامێریی حەزرەتی ئەبوبەکر چارەی ئەمەی دەکرد.

حەزرەتی ئەبوبەکر لە پێغەمبەرمانی پرسی:

– ئەی پێغەمبەری خوا ئایا چ ڕێگرییەك هەیە بۆ ئەوەی لەگەڵ خێزانەکەتدا لەژێر چەتری یەك ماڵدا بن؟

پێغەمبەریشمان (دروودی خوای لێبێت) فەرمووی:

– مارەیی.

چاوەڕێی ئەوە نەدەکرا کە حەزرەتی ئەبوبەکر بایەخ بەمە بدات. لەڕاستیشدا هەر بەو شێوەیە بوو. ئەو مارەییەی کە دەبوایە پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) بۆ حەزرەتی عائیشەی بکردایە، حەزرەتی ئەبوبەکر خۆی بۆ سەروەرمانی دابین کرد. پێغەمبەری ئازیزیشمان (دروودی خوای لێبێت) دەستبەجێ ئەو مارەییەی نارد بۆ حەزرەتی عائیشە. سەرەڕای ئەمەش حەزرەتی ئەبوبەکر یارمەتی پێغەمبەری خۆشەویستی دا لە دروستکردنی ژوورێکدا بۆ خۆی و حەزرەتی عائیشە لە پەنای مزگەوتدا. بەمەش مەردایەتی و جوامێریی خۆی بە پایان گەیاند. بەمشێوەیە خانەی بەختەوەریی پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) و عائیشەی دایکمان بنیاتنرا. تەنها هاوسەرگیرییەکەیان مابوویەوە، کاتێك ڕۆژژمێرەکان مانگی شەوالیان نیشان دەدا، ئەمەش هاتە دی. مارەبڕینەکەشیان لە مانگی شەوالدا بەمانای لەناوبردنی هەڵە تێگەیشتنێکی سەردەمی نەفامی دەهات. چونکە مرۆڤەکان لەو سەردەمەدا بڕوایان وابوو کە ئەو هاوسەرگیرییەی لەنێوان

دوو جەژندا دەکرێت بەدبەختی بەدوای خۆیدا دەهێنێت. بەمشێوەیە ئەم هەڵە تێگەیشتنەش لەناوبرا. کاری دوای ئەمە خۆئامادەکردنی حەزرەتی عائیشە بوو بۆ چوونە خزمەتی پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خوای لێبێت).

ئەم ئەرکەش کەوتە سەر شانی دایکی. دایکی حەزرەتی عائیشە لەپێش نیوەڕۆیەکدا کە حەزرەتی عایشە لەگەڵ هاوڕێکانیدا کاتی بەسەردەبرد، دەستی حەزرەتی عائیشەی گرت و هێنای بۆ ئەو کۆڕەی کە ئافرەتانی ئەنصاری تێدا کۆبووبوونەوە. دایە عائیشەمان بێ ئاگا بوو لەوەی کە ڕوودەدات و تەواو شڵەژابوو. لەگەڵ ئەسمای کچی یەزید و هەندێك لە هاوڕێیانیدا پێکەوە چوونە خزمەتی پێغەمبەری خۆشەویستمان. پێغەمبەرمان بە کاسەیەك شیر پێشوازی لێکردن. حەزرەتی عائیشە شەرمی دەکرد، سەیری ڕوخساری ئازیزمانی نەدەکرد. هاوڕێکانی داوایان

لێکرد کە دیارییەکە لە پێغەمبەری خۆشەویست وەربگرێت. دایە عائیشەشمان کاسە شیرەکەی لە دەستی سوڵتانی پێغەمبەران وەرگرت و دەستیکرد بە خواردنەوەی. پاشان پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت) داوای لە حەزرەتی عائیشە کرد کە پێشکەشی هاوڕێکانیشی بکات. ئەوانیش وتیان ئارەزووی خواردنمان نییە ئێستا. پێغەمبەری خۆشەویستیشمان فەرمووی:

– برسێتی و درۆ لەیەك کاتدا نابێت.

هاوڕێکانی حەزرەتی عائیشە ئامادەبوونیان لە حزووری سوڵتانی پێغەمبەراندا بە دەرفەت زانی و یەکسەر پرسییان:

– ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر یەکێك ئارەزووی خواردنی هەبێت و بڵێت ئارەزووی خواردنم نییە، هەر بە درۆ دادەنرێت؟

پێغەمبەریشمان فەرمووی:

– بەڵێ، هەروەك چۆن درۆ بە درۆ دادەنرێت، درۆی بچووکیش بە درۆی بچووك تۆمار دەکرێت.

بەمشێوەیە کاسەیەك شیر بووە نانی شایی پێغەمبەری خۆشەویست و دایە عائیشەمان. پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت) کە لە هەموو هەڵسوکەوتێکیدا نموونەیە بۆ ئوممەتەکەی، لە دووربوون لە خۆدەرخستن و بەسەربردنی ژیانی سادەشدا دووبارە پێشەنگبوونی خۆی نیشان دەداینەوە.

# شێوازی ژیانی دایە عائیشەمان:

## سادەیی

شێوازی سادەی ژیانی دایە عائیشەمان لەو خانۆچکە دەستی پێکرد کە تیایدا دەژیا. چونکە ماڵەکەی بریتیبوو لە ژوورێکی بچووك لە تەنیشت مزگەوتی پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت). دیوارەکانی بە قوڕ سواغدرابوون، سەقفەکەی بە ڕیشاڵی دارخورما داپۆشرابوو. بەرزییەکەی لە ئاستێکدا بوو، کە نە ئاسانی دەست دەگەیشتە سەقفەکەی. بۆ ئەوەی ئاوی باران نەیەتە خوارەوە سەربانەکەی بە خوری داپۆشرابوو. ماڵەکە دەرگایەکی یەك تاکیی هەبوو کە لە دار دروستکرابوو. فراوانی خانووەکەش لەم وتانەی دایە عائیشەوە تێدەگەین کە دەڵێت "پێغەمبەری خوا کە بۆ نوێژ دەوەستا

دەستی بەر قاچەکانم دەکەوت بۆیە منیش قاچەکانم کۆدەکردەوە. ئنجا پێغەمبەری خوا دەیتوانی بچێتە سوجدەوە.''

لەماڵەکەی حەزرەتی عائیشەدا تەنانەت مۆمێکیش نەبوو کە تاریکی شەوانی پێ ڕووناك بکاتەوە. کاتێك پێغەمبەری خۆشەویستمان دەچووە دەرەوە، دایە عائیشەش بە دەستخشاندن بە ژوورەکەدا تێدەگەیشت کە لە ماڵەوە نەماوە. ئەم حاڵەش بەمشێوەیە باسدەکات ''لە سەردەمی پێغەمبەردا زۆر شەومان بەسەر بردووە کە لە ماڵەوە نە چرایەك نە شتێکی هاوشێوەمان بۆ ڕووناککردنەوە دانەگیرساندووە، چونکە ئەگەر لەو ڕۆژانەدا ئێمە زەیتمان هەبووایە، ئەوا بۆ دروستکردنی خواردن بەکارمان دەهێنا''.

حەزرەتی عائیشە بەمشێوەیە باسی سادەیی ژیانی لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لێبێت) بۆ عورووەی برازای دەگێڕێتەوە.

– ئێمە تەماشای مانگمان دەکرد. بیست جار هیلالی سەرەتای مانگمان دەبینی، بەڵام هیچ ئاگرێك لە ماڵی پێغەمبەر نەدەکرایەوە.

– باشە چیتان دەخوارد، بەچی ژیانتان دەگوزەراند؟

– بە خورما و ئاو.

دایە عائیشەمان هەتا کۆچی دوایی پێغەمبەریش سێ ڕۆژ لەسەر یەك سکی بە نانی گەنم تێر نەکردووە. لە ڕۆژی کۆچی دوایی سوڵتانی پێغەمبەرانیشدا لە کەمێك جۆ زیاتر

هیچی دیکە لە ماڵەکەیاندا نەبوو. ئەو لەدوای خۆشەویستیشمان هیچ کات هێندەی نەخواردووە کە سکی تێر بکات.

بەسەربردنی ژیان بەم سادەییە لەلایەن پێغەمبەر و دایە عائیشەمان هەرگیز بەهۆی ئەوەوە نەبوو کە زۆریان لێکرابێت بەمجۆرە بژین، بەڵکو ئەمە هەڵبژاردەی خۆیان بوو. ڕۆژێك ئافرەتێك دێتە لای دایە عائیشە و دەبینێت جێگەی نوستنی پێغەمبەرمان بە ڕیشاڵ پڕکراوەتەوە. بۆیە دۆشەکێکی خوری پێشکەشی دایە عائیشە دەکات. کاتێك پێغەمبەری خۆشەویستمان دەگەڕێتەوە ماڵەوە لە دایە عائیشە دەپرسێت:

– ئەمە چییە ئەی عائیشە؟

– ئەی پێغەمبەری خوا فلان ئافرەت لە ئەنصارییەکان هات بۆ ماڵمان، کاتێك جێگەکەی تۆی بینی ئەمەی بەدیاری بۆهێنایت.

پێغەمبەریش (دروودی خوای لێبێت) فەرمووی:

– ئەوە بگەڕێنەرەوە بۆ خاوەنەکەی. سوێند بە خوا ئەگەر بمویستایە خوای گەورە شاخەکانی دەخستە ژێر فەرمانم و دەیگۆڕین بە ئاڵتوون و زیو بۆم.

# ئاسۆی بەخشینی

## دایە عائیشە

دایە عائیشە کەسێکی بەخشندە بوو. حەزی دەکرد ئەوەی هەیەتی لەگەڵ هەژاراندا بەشی بکات. ڕۆژێکیان کەسێکی هەژار دێتە لای دایە عائیشەمان (ڕەزای خوای لێبێت). ئەویش هەرچییەکی لە دەستدا بوو وەك خێر بەخشییە ئەو کەسە. پاش کەمێك دایە عائیشە داوای کرد بانگی ئەو کەسەی بۆ بکەن کە خێرەکەی پێداوە. پێغەمبەری خوا لەوکاتەدا کە ئەمەی بینی فەرمووی:

— بەدوای ئەو چاکە و بەخشینانەدا مەچۆ کە کردووتن، تا بەرامبەر خۆشت هەمان شت نەکرێتەوە.

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خۆشەویست چەند ئەڵقەیەکی زیوی لە دەستی دایە عائیشەدا بینی.

– پرسی ئەمانە چییە ئەی عائیشە؟

– ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانەم لەبەر تۆ بەخۆمەوە کردووە تا خۆمت بۆ بڕازێنمەوە.

– زەکاتی ئەوانەت داوە؟

– نەخێر

– خۆشەویستمان فەرمووی "ئەمانە بەسن بۆئەوەی بەرەو دۆزەخت بەرن."

لەدوای ئەم هۆشدارییە حەزرەتی عائیشە هەرچی لە توانایدا بووایە و هەر شتێکی هەبووایە دابەشی دەکرد بەسەر هەژاراندا.

پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) کاتێك ئەم هەڵوێستەی تێدا بەدیکرد ئەم وەسیەتەی بۆ کرد:

– ئەگەر دەتەوێت لە دواڕۆژدا بە من شادببیتەوە، دەبێت پشکی تۆ لە دنیادا وەك ڕێبوارێك بێت. لەگەڵ دەوڵەمەندە چرووکەکاندا هەڵسوکەوت مەکە. جلەکانت مەگۆڕە، هەتا نەگاتە ئەو ئاستەی چیدی بەکەڵکی لەبەرکردن نەیەن.

پێغەمبەری خۆشەویستمان بەمشێوەیە ئامۆژگاری دایە عائیشە و هەموو ئەندامانی خانەوادەکەی دەکرد:

"مرۆڤ ئەگەر دوو دۆڵی پڕ سامانی هەبێت، هێشتا سێیەمیشی دەوێت. چاوی مرۆڤ بە خاك نەبێت بە هیچی دیکە تێرنابێت. لە کاتێکدا ماڵ و سامان تەنها بۆ ئەوەیە کە نوێژەکان بە باشی ئەنجام بدرێن و بتوانرێت زەکاتی لێ دەربکرێت. وە هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە خوای گەورە تەوبەی ئەوانە وەردەگرێت کە تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ لای."

# بایەخدانی دایە عائیشەمان

# بە منداڵان

دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) یاری منداڵانەی هەبوو بۆ ئەو منداڵانەی کە دەهاتنە سەردانی بۆ ماڵەوە. جارێکیان پێغەمبەری خۆشەویستمان لە تەنیشت ئەوەوە ئەسپێکی باڵدار دەبینێت و دەپرسێت:

– ئەمە چییە ئەی عائیشە؟

– ئەسپ.

– مەگەر دەکرێت ئەسپ باڵی هەبێت؟

وەڵامی دایە عائیشەمان بۆ پێغەمبەر ئەوە پیشاندەدات کە زۆر قورئان دەخوێنێتەوە و شارەزای قورئانە:

– ئەی ئەوە نییە ئەسپەکانی حەزرەتی سولەیمان باڵیان هەبووە!

ئەم وەڵامە خێرایەی حەزرەتی عائیشە پێغەمبەری خۆشەویستمانی خستە پێکەنین.

# خۆشەویستی دایە عائیشە بۆ پێغەمبەری سەروەرمان

دایە عائیشەمان پێغەمبەری خۆشەویستمانی زۆر خۆشدەویست، کاتێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا دەبوو، نەیدەویست ئەم پێکەوەبوونە بە هیچ شتێکی دی بگۆڕێتەوە. چەندەها جار پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت) سەری لەسەر ئەژنۆی دایە عائیشەمان دادەنا و پشووی دەدا. ئەگەر دایکمان تەنانەت نارەحەتیش بووایە نەدەجووڵایەوە و چاوەڕێی دەکرد تا ئاسوودەیی پێغەمبەری خۆشەویستمان تێك نەدات. ڕۆژێکیان پێغەمبەری ئازیزمان فەرمووی:

— ئەی عائیشە بڕوانە ئەوە جوبرەئیلە سەلامت لێ دەکات.

دایە عائیشەمان وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و فەرمووی:

– سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوای لەسەر بێ، ئەوەی ئێمە نایبینین تۆ دەیبینیت، ئەی پێغەمبەری خوا.

دایە عائیشەمان بەم وتانەی سەرسامیی خۆی بە پلەوپایەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) دەردەبڕی، چونکە تەنها پێغەمبەری خوا فریشتەی وەحی دەبینی و کەسی تر نەیدەبینی.

# خۆشەویستیی پێغەمبەری خوا بۆ دایە عائیشە

پێغەمبەری خۆشەویستیشمان دایە عائیشەی زۆر خۆشدەویست. ئەو هاوەڵانەی کە ئەم خۆشەویستییەی پێغەمبەریان دەبینی بۆ دایە عائیشە بە "خۆشەویستەکەی پێغەمبەر" بانگی دایە عائیشەیان دەکرد.

کاتێك هاوەڵان دیارییان دەهێنا بۆ پێغەمبەری خۆشەویستمان ئەو کاتانەیان هەڵدەبژارد کە پێغەمبەر لە ماڵەکەی حەزرەتی عائیشە بوو، چونکە کاتێك لای دایە عائیشە بوو ڕوخساری وەك گوڵ دەدرەوشایەوە.

حەزرەتی عائیشەش هەستی بەم خۆشەویستییەی پێغەمبەر

کردبوو بەرامبەری. کاتێك لە پێغەمبەری خۆشەویستیان دەپرسی ''کێت لە هەمووان زیاتر خۆشدەوێت؟'' دەیفەرموو ''عائیشە.''

دەیانپرسی ''لە پیاواندا کێت لە هەمووان زیاتر خۆشدەوێت؟'' دەیفەرموو''باوکی عائیشە.''

ڕۆژێك یەکێك لە دراوسێکان بانگهێشتی پێغەمبەری خۆشەویستمان دەکات بۆ نان خواردن. پێغەمبەری خۆشەویستیشمان دەپرسێت:

– عائیشەش بانگهێشت دەکەن؟

دراوسێکەیان دەڵێت:

– نەخێر.

بەم هۆیەوە پێغەمبەری ئازیزمان بانگهێشتی دراوسێکەیان پەسەند ناکات. ماوەیەکی بەسەردا دەڕوات. دووبارە هەمان دراوسێ دێت و بانگهێشتی دەکاتەوە بۆ ماڵی خۆیان.

پێغەمبەری خۆشەویستمان دەپرسێت:

– عائیشەش بانگهێشت دەکەن؟

پیاوەکە هەمان وەڵام دەداتەوە:

– نەخێر.

بۆیە دووبارە وەڵامی پێغەمبەریش نەخێر دەبێت بۆ بانگهێشتەکە.

دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر، پیاوەکە جارێکی تر بانگهێشتی پێغەمبەر دەکاتەوە. پرسیارەکەی پێغەمبەر خۆشەویستیشمان ناگۆڕێت، ئەم جارەشیان دەپرسێتەوە:

– عائیشەش بانگهێشت دەکەن؟

پیاوەکەش دەڵێت:

– بەڵێ.

ئیدی ئەمجارەیان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بانگهێشتەکە پەسەند دەکات. بایەخدانی پێغەمبەرمان بە دایە عائیشە تەنها لە خۆشویستنی خودی ئەوەوە سەرچاوەی نەگرتبوو. ڕۆژێکیان لە هۆکاری خۆشەویستیی پێغەمبەریان بەرامبەر دایە عائیشە پرسی، پێغەمبەریش (دروودی خوای لێبێت) فەرمووی:

– لەناو خێزانەکانمدا تەنها کاتێك لای حەزرەتی عائیشە دەبم سروش (وەحی)م بۆ دێت.

# خۆشی

ڕۆژێکی جەژن کۆمەڵێك کەس نمایشیان بە شمشێر و قەڵغان دەکرد، خەڵکەکەش کۆبووبوونەوە و سەیریان دەکردن. حەزرەتی عائیشەی دایکیشمان لەناو قەرەباڵغییەکەدا بوو. بەڵام بەهۆی ئەوەی لەدواوە بوو نەیدەتوانی بیانبینێت، بۆیە بە پێغەمبەری خۆشەویستمانی وت کە دەیەوێت سەیریان بکات و بیانبینێت.

پێغەمبەری خۆشەویستمان پرسی:

– بەڕاستی دەتەوێت سەیری ئەوان بکەیت؟

دایە عائیشەمان سەری لەقاند و وتی:

– بەڵێ.

بەم هۆیەوە پێغەمبەری خۆشەویستمان ئەوی خستە سەر پشتی. بەجۆرێك ڕوومەتی دایە عائیشەمان بەر ڕوومەتی پیرۆزی پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) دەکەوت. لەدوای ماوەیەك سەیرکردن، پێغەمبەرمان لە دایە عائیشە دەپرسێت:

– ئەوەندە بەسە؟

دیاربوو پێغەمبەری خۆشەویستمان ماندوو بووبوو.

عائیشەی دایکمان وتی:

– بەڵێ

پێغەمبەری خۆشەویستیشمان فەرمووی:

– دەی کەواتە بڕۆرەوە.

# پێشبڕکێ

ڕۆژێکیان پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت) لەگەڵ سوپاکەیدا لە سەفەرێك دەگەڕانەوە. پێغەمبەری خۆشەویستمان دایە عائیشەشی لەگەڵدا بوو. دوای ماوەیەك لە ڕێکردن پێغەمبەری خۆشەویستمان بە سوپاکەی فەرموو:

– ئێوە بەردەوام بن لە ڕۆیشتن.

پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) لەدواوە لەگەڵ دایە عائیشەدا مانەوە، پێغەمبەرمان پێی فەرموو:

– دەی با پێشبڕکێ بکەین.

ئەوەبوو دەستیان بە ڕاکردن کرد و لە پێشبڕکێکەدا دایە عائیشەمان (ڕەزای خوای لێبێت) پێش پێغەمبەرمان کەوت.

دوای ماوەیەکی زۆر دایە عائیشە لەگەڵ ئازیزماندا بۆ گەشتێکی دیکە بەڕێکەوتن. پێغەمبەری خۆشەویستیشمان بەوانەی کە لەگەڵیدا بوون فەرمووی:

— ئێوە بەردەوام بن لە ڕۆیشتن.

پێغەمبەریش لەگەڵ دایە عائیشەدا لەدواوە مانەوە و پێغەمبەر بەهەمان شێوەی جاری پێشوو ڕووی کردە دایە عائیشە و فەرمووی:

— دەی با پێشبڕکێ بکەین.

بێگومان دایکمان "عائیشە" شتێکی لەمجۆرەی ڕەت نەدەکردەوە، ئەمجارەشیان پێشبڕکێیان کرد، لە پێشبڕکێکەی ئەم جارەدا پێغەمبەری خۆشەویستمان پێشی دایە عائیشەی دایەوە.

پاش پێشبڕکێکە پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) ڕوویکردە دایە عائیشە و فەرمووی:

— ئەمە لە بەرامبەر پێشبڕکێی یەکەمدا بوو کە تۆ بردتەوە.

# پەروەردەیەکی هەستیارانە

پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) بۆ تەواوکردنی ڕەوشتی جوان نێردرابوو. وە نزیکترین کەسیش لێیەوە دایە عائیشە بوو کە ڕەوشتی جوانی ئازیزمانی دەبینی و لێوەی فێردەبوو. جارێکیان دایە عائیشەمان لە ئاردی جۆ چۆرەکێکی بچووکی بۆ پێغەمبەری خۆشەویستمان ئامادەکردبوو. کە پێغەمبەری خۆشەویستمان هاتەوەماڵەوە یەکسەر خەوت. لەوکاتەدا مەڕی دراوسێکەیان ئەو چۆرەکە بچووکەی کە دایە عائیشەمان دروستیکردبوو هەڵگرت و ڕایکرد. بە بردنی ئەو چۆرەکەی کە بۆ خۆشەویستمانی ئامادەکردبوو، دایە عائیشە زۆر دڵگران دەبێت، بۆیە دەکەوێتە ڕاکردن بەدوای مەڕەکەدا، لەم کاتەدا پێغەمبەری خۆشەویستمان بەخەبەر دێت و بە دایە عائیشەمان دەفەرموێت:

—ئەگەر مەڕەکەت گرت تەنها چۆرەکەکەتی لێ وەربگرەوە، نەکەیت بەهۆی ئەوەی مەڕەکە کردی دڵی دراوسێکەمان ئازار بدەیت.

# نوێژی دایە عائیشەمان

دایە عائیشەمان بەدرێژایی نۆ ساڵی ژیانی لەگەڵ پێغەمبەردا هەمیشە وەك سەرمەشق لە پێغەمبەرمانی ڕوانیوە. هەر لەبەرئەوەش بوو پەرستشەکانی لە پەرستشی پێغەمبەری ئازیزمان دەچوو. پێغەمبەرمان شەوانە هێندە نوێژەکانی درێژدەکردەوە تا پێیەکانی دەئاوسان.

دایە عائیشەمان کاتێك باسی نوێژی پێغەمبەرمانی دەکرد بەمشێوەیە باسی دەکرد:

— جوانی و درێژیی شەونوێژەکانی هێندە بێوێنە بووە کە لە باس نایەت.

پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) لەدوای بەجێهێنانی نوێژی عیشا دەخەوت و لە ناوەڕاستی شەودا هەڵدەستایەوە و شەونوێژی دەکرد.

لەدوای ماوەیەك دایە عائیشەشی بۆ شەونوێژ بەخەبەر دەهێنا. دایە عائیشەمان نوێژی شەونوێژ و دواتر ویتری دەکرد. کاتێ نوێژی بەیانی دادەهات پێغەمبەرمان دوو ڕکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی دەکرد. دوای ئەوە لەسەر لای ڕاست ڕادەکشا تا ئیسراحەت بکات، یان لەگەڵ دایە عائیشەدا قسەی دەکرد. لەکاتی ئەنجامدانی نوێژی بەیانی لە مزگەوت، دایە عائیشەش بەشداردەبوو لە کردنی نوێژی بەکۆمەڵ لە ژوورەکەی خۆیەوە.

بایەخدانی دایە عائیشەمان بە شەونوێژ لەم ئامۆژگارییەوە تێدەگەین:

– بە هیچ جۆرێك شەونوێژ فەرامۆش مەکە، چونکە پێغەمبەری خوا هیچکات شەونوێژی فەرامۆش نەکردووە، بەشێوەیەك ئەگەر نەخۆش یان ماندوو بووایە بە دانیشتنەوە نوێژەکەی دەکرد، بەڵام هەرگیز فەرامۆشی نەدەکرد.

دایە عائیشەمان ئەو سوننەتە نافیلانەی کە لەکاتی خۆیدا نەیدەکرد دواتر قەزای دەکردەوە. وە لەدوای بینینی ئەوەی کە پێغەمبەری خۆشەویستمان نوێژی چێشتەنگاو دەکات ئەویش هیچ کات وازی لە کردنی ئەم نوێژە نەهێنا.

بەیانییەك برازاکەی هاتە لای، بینی کە نوێژ دەکات، بۆیە پرسی ”ئەم نوێژە چییە؟“

دایە عائیشەش وەڵامی دایەوە و فەرمووی:

– شەونوێژم هیچ کات فەرامۆش نەکردووە، ئەمشەو نەمتوانی ئەنجامی بدەم بۆیە ئێستا دەیگێڕمەوە.

ڕۆژێکیان کەسێك بەمەبەستی پرسیارکردن لەسەر بابەتێك دێتە لای دایە عائیشەمان. لەوکاتەدا دایە عائیشە نوێژی چێشتەنگاو دەکات. بۆیە کەسەکە وتی:

– چاوەڕێ دەکەم هەتا نوێژەکەی تەواو دەبێت.

یەکێك لەوانەی دەوروبەری کە گوێی لەم قسەیە بوو، وتی:

– تا کەی چاوەڕێ دەکەیت؟ بەڵام ئەو کەسە لەمە تێنەگەیشت، لەڕاستیدا ئەم قسەیە بەواتای ئەوە دەهات کە دەبوایە ئەو کەسە بۆ ماوەیەکی زۆر چاوەڕێی تەواوبوونی نوێژەکەی دایە عائیشەی بکردایە. چونکە ئەو کاتێك دەوەستا بۆ نوێژ پەیوەندی لەگەڵ دنیادا دەپچڕاند و بە دوورودرێژی نوێژی خۆی دەکرد.

ڕۆژێکیان دایە عائیشەمان (ڕەزای خوای لێبێت) نوێژی دەکرد، لەژێر کاریگەری ئەو ئایەتەی کە دەیخوێند دەستی کرد بە گریان. لە ئایەتەکەدا خوای گەورە بەمشێوەیە دەفەرموێت ''خوای گەورە ئێمەی لە ڕیزی چاکەکاران دانا و لە سزای دۆزەخ ئێمەی پاراست.'' دوای خوێندنی ئەم ئایەتە دایە عائیشەمان بەمشێوەیە کەوتە پاڕانەوە:

''خوایە گیان منیش لە ڕیزی چاکەکاران دابنێ و لە سزای دۆزەخ بمپارێزە.''

کاتێ عوروەی برازای ئەمەی بینی دانیشت لە تەنیشتییەوە و چاوەڕێی دەکرد تا تەواو ببێت. هێندە چاوەڕێی کرد ماندووبوو، بۆیە ڕۆیشت بۆ بازاڕ بۆ ئەوەی ئەو کارەی هەیبوو ئەنجامی بدات. عوروە لەدوای ڕاپەڕاندنی کارەکەی گەڕایەوە، بەڵام ئەو دیمەنەی کە بینی بە تەواوی سەرسامی کرد. چونکە هێشتا دایە عائیشەمان بە دەم گریان و هەنسکەوە لە نوێژکردنەکەی بەردەوام بوو.

دایە عائیشەمان (ڕەزای خوای لێبێت) لە هەمان کاتدا زۆر بایەخی بە نوێژی بەکۆمەڵ دەدا. جا لەبەرئەوەی ژوورەکەی بە تەنیشتی مزگەوتەوە بوو، هەموو نوێژە فەرزەکانی لە ژوورەکەی خۆیەوە بەکۆمەڵ لەگەڵ پێشنوێژدا دەکرد. جارجاریش حەزرەتی "زەکوان" کە کۆیلەیەکی ئازاد کراو بوو دەکردە پێشنوێژ و لە پشتییەوە نوێژی دەکرد.

# ڕۆژووی دایە عائیشە

دایە عائیشە زۆرینەی ڕۆژەکان بەڕۆژوو دەبوو. تەنانەت لەکاتی سەفەرکردنیشدا وازی لە ڕۆژووگرتن نەدەهێنا. دایە عائیشە هەر پەرستشێکی ئەنجام بدایە، بە ڕێکوپێکی و تا کۆتایی لەسەری بەردەوام دەبوو. ڕۆژێکی عەرەفە بەڕۆژوو بوو عەبدوڕڕەحمانی برای (ڕەزای خوای لێبێت) هات بۆلای. کەشوهەوا زۆر گەرم بوو. براکەی کە بینی دایە عائیشەمان ڕۆژووەکەی زۆر ناڕەحەتی کردووە، پێی وت:

– بۆ ڕۆژووەکەت ناشکێنیت؟

دایە عائیشەمان لە وەڵامدا وتی:

– ڕۆژووەکەم ناشکێنم چونکە بیستوومە کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی "ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە دەبێتە مایەی لێخۆشبوونی گوناهەکانی ساڵی پێشوو."

# دایە عائیشە و حەج

دایە عائیشە یەك جار هەلی حەجکردنی لەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویستدا بۆ ڕەخسا، کە ئەمەش یەکەم و کۆتا حەجی پێغەمبەری خۆشەویستمان بوو. واتە حەجی ماڵئاوایی بوو. لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) دایە عائیشەمان چەندین جار دەرفەتی چوون بۆ حەجی بۆ هەڵکەوت.

ویستی ڕۆشتن بۆ حەج لای حەزرەتی عائیشە لەم ڕووداوەوە سەرچاوەی گرتووە.

ڕۆژێکیان دایە عائیشەمان پرسیارێکی بەمشێوەیەی ئاڕاستەی پێغەمبەرمان کرد.

– ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ناکرێت ئێمەش وەك ئێوە بەشداری لە جەنگ و جیهاد بکەین؟

داواکارییەکەی دایە عائیشەمان لە دڵێکی پڕ دڵسۆزییەوە بوو. ئەو دەیویست خزمەتێکی زیاتر بە ئایینی ئیسلام بکات. بەڵام پێکهاتەی جەستەیی و دەروونی مرۆڤەکان داخوازیی تایبەت بە خۆیان هەیە، لەژێر ڕۆشنایی ئەمەدا نەدەکرا کە ئافرەتان وەك پیاوان بەشداری لە جەنگدا بکەن.

لە بەرامبەردا خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) ئەم ئامۆژگارییەی بە دایە عائیشەمان فەرموو:

– باشترین و جوانترین جیهادی ئافرەت حەجێکی قبووڵکراوە.

بیستنی ئەمە بەس بوو بۆ حەزرەتی عائیشە، لەدوای ئەم هەواڵە بایەخێکی زۆر زیاتری بە حەج دەدا و هەر کاتێك حەجی بکردایە ئەم ئامۆژگارییەی سەروەرمانی بە خەڵکی ڕادەگەیاند.

– لەسەرەتای ساڵانی بەجێگەیاندنی فەریزەی حەجدا ژمارەی

سەردانیکەرانی ماڵی خوا کەم بوو. لەبەرئەوە دایە عائیشەمان لەگەڵ هەموو کەسێکدا پێکەوە تەوافیان دەکرد. بەڵام بە تێپەڕبوونی کات ژمارەی سەردانیکەرانی ماڵی خوا زیادی دەکرد. دایە عائیشەمان هەوڵیدەدا بەبێ تێکەڵ بوونی لەگەڵ پیاواندا تەواف بکات. لەبەر ئەمە چاوەڕێی چۆڵ بوونی دەوری کەعبەی دەکرد بۆ ئەوەی تەواف بکات یاخود لە بازنەیەکی فراواندا تەوافەکەی دەکرد.

# دایە عائیشەمان و خێرکردن (بەخشین)

لە بەخشین و یارمەتیدانی هەژاراندا دایە عائیشەمان (ڕەزای خوای لێبێت) نموونە بوو. ئەوەی لە دەستیدا بوو بە هەر شێوەیەك بووبێت لەگەڵ هەژاراندا بەشی دەکرد. تەنانەت ئەو دیارییانەشی کە بۆی دەهاتن دەینارد بۆ ئەوانەی کە پێویستییان پێی بوو.

کاتێك حەزرەتی موعاوییە (ڕەزای خوای لێبێت) خەلیفە بوو، جلوبەرگ و زیو و کۆمەڵێك شت کە پێویستن بۆ بەکارهێنان، ناردی بۆ دایە عائیشە. دایە عائیشە کە ئەوانەی بینی دەستی کرد بە گریان و وتی:

— پێغەمبەر هیچ یەکێك لەمانەی نەبوو.

دواتر کردنی بە چەند بەشێکەوە و ناردنی بۆ هەژاران. بەجۆرێك

هەتا ئێوارە هیچ یەکێ لەو شتانەی کە بۆی نێردرابوو لە دەستیدا نەمایەوە.

ڕۆژێکیان چەند سەبەتەیەک ترێیان هێنا بۆ دایە عائیشە، ئەویش خێرا دەستیکرد بە دابەشکردنی بەسەر هەژاراندا. بەڵام شتێک هەبوو کە ئەو هەستی پێنەکردبوو، ئەویش ئەوەبوو کە یەکێک لەو کەسانەی لەگەڵیدا بوو، کەمێک لەو ترێیەی بێ ئاگاداری دایە عائیشە جیاکردبووەوە و هەڵی گرتبوو.

دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک بەسەر دابەشکردنی ئەو ترێیەدا ڕۆژێک هەندێک لەو ترێیە دەهێنن بۆ دایە عائیشە، ئەویش زۆر سەری سووڕدەمێنێت و دەپرسێت:

– ئەمە چییە؟

کاتێک تێدەگات ئەمە لە هەمان ترێیەکەی پێشووە کە بە تایبەت بۆیان جیاکردووەتەوە، زۆر دڵگران دەبێت و دەڵێت:

– هێشوویەک ترێتان نەداوە بە هەژاران و بۆ منتان هێناوە؟!

سوێند بەخوا نە دەستی لێدەدەم و نە دەشیخۆم.

ڕۆژێک کەسێک دێتە لای دایە عائیشە و داوای خواردنی لێدەکات. دایە عائیشەشمان کاسەیەکی پڕ لە نانی پێدەدات. لەدوای ئەو کەسێکی دیکە دێت کە هاوسەنگیی عەقڵی زۆر تەواو نابێت. دایە عائیشەش بانگی دەکاتە لای خۆی و ئەو خواردنەی لە دەستیدایە پێشکەشی دەکات. کەسەکە لەدوای

ئەوەی سکی تێردەبێت دەڕوات. ئەوانەی لەوێ بوون هۆکاری ئەم کارەیان لە دایکمان پرسی.

دایە عائیشەش وەڵامێکی زۆر واتاداری دانەوە و فەرمووی پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) فەرموویەتی "بە پێی پلەوپایەی کەسەکان مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکەن." من کە ئەم فەرمایشتە بزانم ئیتر چۆن بەشێوازێکی دیکە ڕەفتار دەکەم...

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لەسەردەمی جێنشینیدا کیسەیەك ئاڵتوونی نارد بۆ دایە عائیشە. دایە عائیشەش لە بەرامبەر ئەمەدا دڵی پڕبوو و دەستی بە گریان کرد. پاشان هەموو ئەو ئاڵتوونانەی بەسەر دەوروبەرەکەیدا دابەشکرد. دایە عائیشەمان بەمەشەوە نەوەستا، بەڵکو پاڕایەوە کە جارێکی دیکە ڕووبەڕووی چاکەیەکی ئاوا نەبێتەوە. ئەو ژیانی لەگەڵ خۆشەویستترین بەندەی خوادا بەسەربردبوو. لە ئەوەوە فێربووبوو کە لەناو خەڵکدا وەك تاکێك

لە ئەوان بێت و وەك ئەوان بژی. ئەم دەستوورەشی بەدرێژایی ژیانی جێبەجێکرد.

یەکێك لەوانەی کە سەردانی دایە عائیشەی کردووە بەمشێوەیە حاڵی دایە عائیشەمان بۆ باس دەکات:

"لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەرمان چوومە سەردانی دایە عائیشە. بینیم چاوی پڕ لە گریان بوو، خواردنی پێشکەشی من کرد و فەرمووی:

– دەمەوێت تا فرمێسکەکانم وشك دەبنەوە بگریم، بۆیە نامەوێت هیچ بخۆم."

بە سەرسوورمانەوە پرسیم:

– بۆچی؟

ئەویش فەرمووی:

– شێوازی ژیانی پێغەمبەرم دێتەوە یاد، ئەو هەتا لە ژیاندا بوو لە ڕۆژێکدا زیاد لە دووجار نان و گۆشتی پێکەوە نەدەخوارد و سکی تێر نەدەکرد.

ڕۆژێکیان ئافرەتێك کە دوو منداڵی کچی لە باوەشدا بوو هاتە خزمەتی دایە عائیشەمان. دایە عائیشەش سێ خورمای پێشکەشی میوانەکەی کرد. ئەو ئافرەتەش دوو خورمای دا بە کچەکانی. دوای تەواوکردنی خورماکەیان، خورماکەی

تریشی لەتکرد و لەنێوان کچەکانیدا بەشی کرد. بەمشێوەیە هیچ بۆ خۆی نەمایەوە. دواتر دایە عائیشەمان فیداکاریی ئەم ئافرەتەی بۆ پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) گێڕایەوە. پێغەمبەری خۆشەویستیشمان (دروودی خوای لێبێت) دەربارەی ئەم ئافرەتە ئەم مژدەیەی فەرموو:

– لەدوای ئەم کارەی، خوای گەورە چوونە بەهەشتی بۆ ئەو ئافرەتە نووسی و لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری کرد.

ڕۆژێکیان کەسێك دێتە لای دایە عائیشە و پێی دەڵێت کە هەژارە و داوای شتێکی لێدەکات. دایە عائیشەش زۆر گەڕا بۆ ئەوەی شتێکی بۆ بدۆزێتەوە، بەڵام تەنها ئەو کولێرەیەی دۆزییەوە کە دایناببوو بۆ ئێوارە بەربانگی ڕۆژووەکەی پێبکاتەوە.

کاتێك یەکێك لەوانەی لە نزیکی بوو هەستی بەمە کرد دایە عائیشەی ئاگادارکردەوە و پێی وت:

– گەر ئەمە ببەخشیت هیچ شتێك بۆ خۆت نامێنێتەوە کە بەربانگی پێبکەیتەوە.

دایە عائیشەش فەرمووی:

– ئەوە بدە بەو هەژارە.

ئەو کەسەش بەگوێی دایە عائیشەی کرد و خواردنەکەی بەخشی بە هەژارەکە.

دەمەوئێوارە چەند کەسێك دیارییان بۆ دایە عائیشە هێنا. لەناو دیارییەکانیشدا نان و گۆشتی مەڕیش هەبوو. بەڵێ، ئەو کەسەی ببەخشێت خواوەندیش پێی دەبەخشێت.

کە ئێوارە هات دایە عائیشە بانگی ئەو کەسەی کرد کە ئاگاداری کردبوویەوە لە بەخشینی کولێرەکە و بەگاڵتەوە وتی:

– فەرموو لەمە بخۆ! هەرچۆنێك بێت ئەمە لە کولێرە وشکەکەی تۆ دەتوت "مەیبەخشە" باشترە.

دایە عائیشەمان (ڕەزای خوای لێبێت) لە پێغەمبەری خۆشەویستمانەوە فێربووبوو کە ئەوەی هەیەتی لەگەڵ بەندەکانی خوادا بەشی بکات. ئەو بیستبووی کە پێغەمبەری خۆشەویست دەیفەرموو "ئەگەر بە بەخشینی نیوە خورمایەکیش بێت بە هەژاران، خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن." دوای بیستنی ئەمە ئیدی بەدرێژای ژیانی لە بەخشین و یارمەتیدانی کەسانی دیکە بێ وچان بەردەوام بوو. جارێکیان ئاژەڵێکیان کرد

بە قوربانی، دایە عائیشەشمان خێرا هەمووی دابەشکرد بەسەر هەژاراندا، تەنها چەند ئێسقانێکی مابوویەوە.

کە پێغەمبەری خۆشەویست هاتەوە ماڵەوە پرسی:

– عائیشە چیتان لە قوربانییەکە کرد؟ چی لێ ماوەتەوە؟

دایە عائیشەش وەڵامی دایەوە و فەرمووی:

– هەموویم دابەشکرد، تەنها چەند ئێسقانێکی بۆ ئێمە ماوەتەوە.

ئەوەی پێغەمبەری سەروەریش دەیویست هەر ئەمە بوو. چونکە خوای گەورە بەڵێنی داوە هەرکەس لە پێناو ڕەزامەندی ئەودا ماڵ ببەخشێت، بۆی زیاد دەکات. ئەو خێرەی بە مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا دەکرێت بۆ هەمیشە تۆمار دەکرێت.

بەمشێوەیەش ئەو ماڵ و سامانەی لە پێناو خوادا دەبەخشرێت، دەبێتە شتێکی هەمیشەیی و لە دوارۆژدا بە چەندهێندە پێشکەش بە خاوەنەکەی دەکرێت.

# بایەخدانی دایە عائیشە به باڵاپۆشی

دایە عائیشەمان دەربارەی باڵاپۆشی زۆر هەستیار بوو. تەنانەت لە بەرامبەر نابینایانیشدا هەستیاری خۆی سەبارەت بە باڵاپۆشی دەپاراست. جارێکیان نابینایەك دێت بۆ لای دایە عائیشە، دایە عائیشەش دەچێتە پشت پەردەکەوە. ئەمەش ئەو کەسە تووشی سەرسوورمان دەکات و دەڵێت:

– ئایا لەبەر من خۆت لە پشت پەردەکەوە دەشاریتەوە، لەکاتێکدا من ناتبینم؟

وەڵامی دایە عائیشەشمان بەمشێوەیە بوو.

– ڕاستە تۆ من نابینیت بەڵام من تۆ دەبینم.

دایە عائیشەمان ئەوەی دەیزانی بەشێوەیەکی کردەیی پیشانی قوتابییە نزیکەکانی دەدا. بۆ نموونە، یەکێك لە کەسە

نزیکەکانی کۆیلەیەکی بە ناوی سەلیم هەبوو، ڕۆژێکیان هات بۆلای دایە عائیشە و داوای لێ کرد فێری دەستنوێژی بکات.

دایە عائیشەش بەوشێوەیەی کە پێغەمبەری خۆشەویستمان دەستنوێژی گرتووە بە کردار نیشانی سەلیمی دا. سەلیم بەهۆی ئەوەی کۆیلەی یەکێك لە کەسە نزیکەکانی بوو، حەزرەتی عائیشە ئەوی بە کەسێکی نزیکی خۆی قبووڵ دەکرد. دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك هاتەوە بۆلای دایە عائیشە و پێی وت:

– ئەی دایکی موسڵمانان نزام بۆ بکە

دایە عائیشەش پرسی بۆچی؟

سەلیم وتی:

– خوای گەورە لە کۆیلایەتی ڕزگاری کردم.

لەبەرئەوە دایە عائیشە فەرمووی:

– پیرۆزت بێت، پاشان یەکسەر پەردەکەی دادایەوە.

چونکە چیدی سەلیم کۆیلەی یەکێك لە نزیکەکانی حەزرەتی عائیشە نییە و کەسێکی ئازادە. حەزرەتی عائیشە تەنانەت لە بەرامبەر مردووشدا سەرپۆشەکەی سەری لا نەدەدا مەگەر ئەوەی خزم و مەحرەمی خۆی بووایە. کاتێك پێغەمبەری خوا و حەزرەتی ئەبوبەکریش کۆچی دواییان کرد گۆڕەکانیان لە نێو خانەکەی پێغەمبەری خوادا بوو. ئەوەبوو پاش کۆچی دوایی حەزرەتی عومەر لەسەر داوای خۆی تەرمی ئەویش هێنرا بۆلای دوو هاوڕێکەی. حەزرەتی عائیشەش دەیفەرموو:

تا ئەو کاتەی تەرمی حەزرەتی عومەر نەهێنرابوویە ژوورەکەی من، بە ئازادی سەرپۆشەکەم لادەدا، چونکە پێغەمبەر هاوسەرم و حەزرەتی ئەبوبەکریش باوکم بووە، بەڵام لەدوای ناشتنی حەزرەتی عومەر لە تەنیشتیانەوە ئیدی من هەرگیز لە ماڵەکەی خۆشمدا بە بێ سەرپۆش نەگەڕاوم.

# بینینی چەندین ڕووداوی

## سەرسووڕهێنەر

جەنگی خەندەق ئەو جەنگە بوو کە بێباوەڕان بە هەموو هێزیانەوە هێرشیان هێنایە سەر شاری مەدینەی پیرۆز بە نیازی ئەوەی وێرانی بکەن و موسڵمانانیش لەناو ببەن. بەڵام موسڵمانان بە هەڵکەندنی خەندەقێك بەرپەرچیان دانەوە و ڕێگرییان لێکرد. دوای ڕووبەڕووبوونەوەیەکی درێژ و تاقەتپڕوکێن کە مانگێکی خایاندبوو، دوژمنان مەیدانی جەنگیان بەجێهێشت و هەڵهاتن. پێغەمبەری خۆشەویستیشمان لەگەڵ هاوەڵانیدا گەڕابوونەوە بۆ مەدینە، چەکەکانیان دانابوو و پشوویان دەدا، پێغەمبەری خۆشەویستمان (درودی خوای لێبێت) لە لای دایە عائیشەوە بوو. لەم نێوەندەدا

لەبەردەم دەرگاکەدا جموجوڵێك پەیدابوو. دایە عائیشەمان کاتێك لە درزی دەرگاکەوە تەماشای کرد، پیاوێکی بە هەیبەتی مێزەرلەسەری زرێلەبەری بینی کە بەسەر ئەسپێکەوە بوو. پیاوەکە بەدەم تەکاندنی خۆڵی سەر جلەکانییەوە بانگی پێغەمبەری خۆشەویستمانی کرد. کاتێك ئازیزمان گوێی لە دەنگی بوو بە خێرایی و هەروەك تیرێك لە کەوان دەرچوو بێت گەیشتە لای. چونکە ئەو کەسەی بانگی لێدەکرد فریشتەی سروش (جوبرەئیل) بوو.

حەزرەتی جوبرەئیل بە پێغەمبەری خۆشەویستی فەرموو:

"ئەی پێغەمبەری خوا چەند بەپەلە لە دانانی چەکەکانتان. لەو ڕۆژەوەی کە دوژمنەکان هاتوون ئێمە وەك فریشتەکان چەکەکانمان لە هیچ شوێنێك دانەناوە. ئێستاش دوای ئەوەی چاودێریمان کردن و دڵنیابووین لەوەی کە چیدی ناتوانن هیچ بکەن ئنجا دەگەڕێینەوە. خوای گەورە خراپترین شکستی بەسەر ئەوان هێنا. خوای گەورە لێت خۆشبێت، بۆچی پێش ئەوەی ئێمە وازبهێنین ئێوە وازتان هێنا؟ دەی با بڕۆین چونکە خوای گەورە فەرمانی پێت کردووە کە لەگەڵ هۆزی بەنی قورەیزەی دوژمندا بجەنگین. ئێستا من لەگەڵ فریشتەکانی یاوەرم دەچینە زێدی ئەوان بۆ لەرزاندنی قەڵاکەیان، تۆش هاوەڵەکانت کۆبکەرەوە و وەرن."

ئەم بانگهێشتە دایە عائیشەمانی تەواو خستە سەرسامییەوە.

پێغەمبەری خۆشەویستمان فەرمووی:

– هاورێکانم زۆر ماندوون، ئەگەر یارمەتییان بدەیت چەند ڕۆژێك پشوو بدەن.

حەزرەتی جوبرەئیل سووربوو لەسەر قسەکەی و فەرمووی:

– هیچ مەوەستە، خێرا بدەن بە سەریاندا، سوێند بەخوا من دەچمە سەریان و لەگەڵ خاکدا دەیانکەم بەیەك.

دوای وتنی ئەمانە حەزرەتی جوبرەئیل گەڕایەوە و هاوشانی ئەوانەی لەگەڵیدا بوون بەرەو پێشەوە بەڕێکەوتن. دایە عائیشەش گوێی لەم گفتوگۆیە دەکرد. کە پێغەمبەر گەڕایەوە لێی پرسی:

– ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە کێ بوو قسەت لەگەڵ دەکرد؟

پێغەمبەر پرسی:

– مەگەر تۆ ئەوت بینی؟

– بەڵێ، بینیم.

پێغەمبەر پرسی ''بە کێ دەچوو؟'' دایە عائیشەش فەرمووی:

– لە دەحیەی هاوەڵت دەچوو.

پاشان پێغەمبەری خۆشەویستمان فەرمووی ''ئەوەی هات جوبرەئیل بوو، فەرمانی هێرشکردنە سەر بەنی قورەیزەی پێ کردم.''

# تەیەمووم

پاش تەواوبوونی جەنگ پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) لەگەڵ هاوەڵانیدا دەگەڕانەوە بۆ مەدینە، سوپاکە لەو شوێنەی کە پێی دەگوترا "زاتولجەیش" وچانێکیان دا. لەوکاتەدا دایە عائیشەمان هەستی بە ونبوونی ئەو ملوانکەیە کرد کە ئەسمای خوشکی وەك سپاردە پێی دابوو. بەهەر شێوەیەك بووبێت دەبوایە بیدۆزیایەتەوە چونکە سپاردە بوو. دایە عائیشەمان لە تاریکایی شەودا گەڕا بەڵام نەیدۆزییەوە، بۆیە چووە لای پێغەمبەر و بابەتەکەی بۆ باسکرد. پێغەمبەریشمان (دروودی خوای لێبێت) هەستاو پێکەوە دەستیانکرد بەگەڕان بەدوایدا، کە هاوەڵانیش ئەم حاڵەیان بینی لەگەڵ ئەواندا دەستیان کرد بە گەڕان بەدوای ملوانکەکەدا، بەڵام گەڕان هیچ سوودێکی نەبوو، لە کۆتاییدا پاش ئەوەی تێگەیشتن

کە ناتوانن ملوانکەکە بدۆزنەوە دانیشتن پشوو بدەن. پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) سەری پیرۆزی لەسەر ئەژنۆی دایە عائیشە دانابوو و پشووی دەدا.

هەندێك لە هاوەڵان بێزاربوون لەوەی بەهۆی گەڕان بەدوای ملوانکەکەدا لێرە لایانداوە، چونکە سوپاکە هیچ ئاوێکیان پێنەمابوو، ئەو شوێنەش کە لێی بوون هیچ ئاوی لێ نەبوو بۆیە ئەم باسەیان لای حەزرەتی ئەبوبەکر باسکرد. کەمێکی مابوو بۆ نوێژی بەیانی، تەنانەت ئاو بۆ دەستنوێژیش نەمابوو، ئیدی حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بێدەنگی شکاند و هات بۆلای دایە عائیشەی کچی، لێی تووڕەبوو فەرمووی:

– تۆ بوویتە هۆی دواخستن و هێشتنەوەی پێغەمبەر و ئەم خەڵکە لەم شوێنەدا، لای هیچ کەس قومێك ئاوی پێنەماوە.

دایە عائیشەمان لە بارێکی زۆر قورسدا بوو، چونکە پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) لەسەر ئەژنۆی خەوتبوو. نەیدەویست ئەو بڕەنجێنێت، لەناکاو پێغەمبەری دوو جیهانیان خەبەری بوویەوە. بەڵام ئاوی بۆ دەستنوێژ لێنەبوو. لە کاتێکدا هەموویان بە ڕەشبینانە بیریان لەوە دەکردەوە کە چی بکەن، هەستیان بە گۆڕانێك کرد لە پێغەمبەری خۆشەویستماندا، دیاربوو دەرگاکانی ئاسمان کرابوونەوە و سروش بۆ حەزرەتی پێغەمبەر دەهات، چونکە

ئەو هەرکات سروشی بۆ بهاتایە، تەنانەت گەر لە زستانیشدا بووایە چین چین ئارەقی دەردەدا. دوای تەواوبوونی وەحی پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) هاوەڵانی ئاگادارکردەوە لەوەی کە بەوەحی دابەزیبوو، پێغەمبەرمان پێی فەرموون کە گەر لە شوێنێکدا بن ئاوی لێ نەبێت، دەکرێت لەسەر خاکێکی پاك بە تەیەمموم دەستنوێژ بگیرێت.

زەردەخەنە کەوتە سەر لێوی هەموویانەوە، کەمێك پێش ئەو کاتە کە تێیدا حەزرەتی ئەبوبەکر لەکچەکەی تووڕەبوو، ئێستا بە دایە عائیشەمان دەفەرموێت:

— کچم تۆ چەند کەسێکی پاکیت؟ بەهۆی ئەو دواکەوتنەمانەوە کە تۆ هۆکاری بوویت، خوای گەورە بەرەکەت و ئاسانکاری پێبەخشین.

بەمشێوەیە نوێژەکەیان کرد و دووبارە خۆیان ئامادەکردەوە بۆ

ڕۆشتن. لەژێر یەکێك لەو حوشترانەی کە هەستا شتێکی بریقەدار سەرنجی دایە عائیشەی ڕاکێشا، چووە نزیکەوە و بۆی نووشتایەوە، بینی کە ئەوە ئەو ملوانکەیەیە کە لە دوێنێوە بۆی دەگەڕان. بەمشێوەیە دڵخۆشییەکەی دایە عائیشەمان دوو هێندە بوویەوە.

# نەخۆشکەوتنی پێغەمبەری خۆشەویستمان

پێغەمبەری خۆشەویستمان بۆ بەڕێکردنی تەرمی یەکێك لە هاوەڵانی ڕۆشت بۆ گۆڕستان، لەکاتی گەڕانەوەدا سەری دەست بە ئازارێکی زۆر کرد و تای لێهات. لەمکاتەدا دایە عائیشەشمان سەری ئازاری هەبوو. دایە عائیشەمان ڕوویکردە پێغەمبەری خۆشەویستمان و فەرمووی "ئای سەرم"، سەروەریشمان فەرمووی "ئای سەرم" نەخۆشییەکەی پێغەمبەری خۆشەویستمان لەدوای ئەو ڕۆژەوە تا دەهات خراپتر دەبوو، بەڵام سەرەڕای نەخۆشییەکەشی دەهاتە مزگەوت و پێشنوێژی بۆ هاوەڵانی دەکرد. لەو ماوەیەدا پێغەمبەری نازدار (دروودی خوای لێبێت) مۆڵەتی لە خێزانەکانی

تری وەرگرتبوو کە تا ئەو دەمەی لە نەخۆشییەکەی چاکدەبێتەوە لای دایە عائیشە بمێنێتەوە. لەگەڵ زیادبوونی نەخۆشییەکەیدا پێغەمبەری خۆشەویستمان "تا"کەی زیادی کرد و لە هۆش خۆی چوو. دوای ماوەیەك کە هاتەوە هۆش خۆی بە دایە عائیشەمانی فەرموو:

– لە چەند بیرێکی جیاواز ئاو دەربهێنە و حەوت جار بیکە بەسەرمدا، چونکە دەمەوێت بچمە نێو خەڵك و قسەیان لەگەڵدا بکەم.

دایە عائیشەش (ڕەزای خوای لێبێت) خێرا کەوتە جوڵە و لە حەوت بیری جیاوازی مەدینەوە ئاوی هێنا و کردی بەسەر پێغەمبەری خۆشەویستدا.

کاتێك پێشەوامان هەستی کرد کەمێك باشبووە فەرمووی:

– هێندە بەسە، سوپاس.

پێغەمبەرمان بە ئازارەوە هەستایە سەرپێ و بە یارمەتی کەسانی دەوروبەری بەرەو مزگەوت بەڕێکەوت.

لەدوای ئەوەی گەیشتە مزگەوت بەمشێوەیە لەگەڵ هاوڕێکانی دوا:

– ئەی خەڵکینە! لێم نزیك ببنەوە، وریابن! هەرگیز گۆڕەکەی من نەکەن بە بتخانەیەك بۆ پەرستش، ئازاری کێم داوە ئەوە

پشتم با بێت بە لێدانی دار مافەکەی وەربگرێتەوە، گەر هەرکەس هەستدەکات قسەی ڕەقم پێوتووە یاخود دڵیم شکاندووە، با بێت و چی لە ناخیدایە پێم بڵێتەوە و مافەکەی وەربگرێتەوە، هەرکەسیش هەر مافێکی تری بەلامەوە مابێت وەریبگرێتەوە.

لەناویاندا کەسێك هەستایە سەرپێ و وتی من سێ درهەمم لەلاتە کە دەبێت وەریبگرمەوە. پێغەمبەریش یەکسەر ڕوویکردە ئامۆزاکەی و ئەو کەسەی پیشاندا کە داوای حەقەکەی دەکات و فەرمووی:

– ئەی "فەضل" ئەمە بدە بەو کەسە.

دوای ئەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) قسەکانی هێنایە سەر باسی ئەنصارەکان (پشتیوانەکان) و فەرمووی:

"ئامۆژگاریتان دەکەم نرخی ئەنصارەکان بزانن، چونکە ئەوان نووری چاوی منن. لەهەمانکاتدا ئەوان لەو کەسانەن کە ئەو

ئەركەی كەوتووەتە سەرشانیان بەباشی هێناویانەتە جێ و پاداشتی كارەكانیشیان وەردەگرنەوە. بەڵام بەهۆی زۆربوونی ژمارەی كەسانی دیكەوە، ئەنصارەكان خەریكە دەبنە كەمینە. بەڵام بیرتان نەچێت ئەوان وەك خوێ وان بۆ چێشت. ئەگەر بوونە فەرمانڕەوا بەسەر ئەوانەوە، ئەوانەیان كاری باش دەكەن لێیان وەربگرن و ئەوانەش كە هەڵەدەكەن لێیان خۆش ببن. پەروەردگار ئەم بەندەیەی سەرپشك كرد لەنێوان هەڵبژاردنی جوانی و خۆشییەكانی دنیا و دوارۆژدا، بەڵام ئەم بەندەیە دوارۆژی هەڵبژارد."

هەر كە وتەكانی پێغەمبەری خۆشەویستمان تەواو بوو، لە سووچێكی مزگەوتەكەوە دەنگێك بەرزبوویەوە.

"دایك و باوكم بەفیدات بێت ئەی پێغەمبەری خوا."

ئەمە لە حەزرەتی ئەبوبەكر باوكی دایە عائیشەمان زیاتر كەسی دی نەبوو. حەزرەتی ئەبوبەكر كەسێكی هەست ناسك و بیرتیژ بوو، دەیزانی كە ئەم قسانەی سەروەرمان قسەی ماڵئاوایین...

# گەشتی هەمیشەیی لە ناخی
# دایە عائیشەمان

ڕۆژبەڕۆژ نەخۆشییەکەی پێغەمبەری خۆشەویستمان سەختتر دەبوو. ڕۆژێکیان بە دایە عائیشەمانی فەرموو:

– نوێژی بە کۆمەڵ ئەنجامدراوە؟

دایە عائیشەمان فەرمووی:

– نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا چاوەڕێی تۆ دەکەن.

پێغەمبەریش فەرمووی:

– ئاوم بۆ ئامادە بکەن تا دەستنوێژ بگرم.

ئەوەی ویستی بۆیان هێنا و دەستنوێژی گرت. لەوکاتەدا کە

ویستی بچێت بۆ نوێژ دووباره له هۆش خۆی چوویەوه. كه هاتەوه هۆش خۆی پرسی:

– خەڵكەكه نوێژیان كردووه؟

دایه عائیشه فەرمووی:

– نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا چاوەڕێی تۆ دەكەن.

پێغەمبەرمان كه زانی ناتوانێت هەستێتەوه، فەرمووی:

– به ئەبوبەكر بڵێن با پێشنوێژییان بۆ بكات.

بەڵام دایه عائیشه داوایەكی له پێغەمبەری خۆشەویست كرد و فەرمووی:

– ئەی پێغەمبەری خوا، باوكم دڵێكی ناسكی هەیه، كه قورئان دەخوێنێت ناتوانێت زاڵ ببێت بەسەر فرمێسكەكانیدا، لەبەرئەوه فەرمان بفەرموون كەسێكی دی پێشنوێژی بكات.

بەڵام پێغەمبەری خوا سووربوو لەسەر قسەكەی و فەرمووی:

– به ئەبوبەكر بڵێن با پێشنوێژیتان بۆ بكات.

پێغەمبەری خۆشەویستمان سووربوو لەسەر فەرمایشتەكەی و دایه عائیشەش سووربوو لەسەر داواكەی كه ئەو كەسەی له میحرابی پێغەمبەردا دەوەستێت حەزرەتی ئەبوبەكری باوكی نەبێت.

پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) بەمشێوەیە کۆتایی بەم بابەتە هێنا.

– ئێوەش دەڵێیت ئەو ئافرەتانەن کە بووبووە مشتومڕیان دەربارەی یوسف! بە ئەبوبەکر بڵێ با ببێت بە ئیمام و پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات.

پاش ماوەیەك پێغەمبەری خۆشەویستمان هەستی کرد تەندروستی باشتر بووە، ئەوەبوو بە یارمەتی دوو لە هاوەڵان هاتە مزگەوت. لەوکاتەدا حەزرەتی ئەبوبەکر نوێژی نیوەڕۆی بۆ خەڵکەکە دەکرد، کاتێك حەزرەتی ئەبوبەکر هەستی کرد کە پێغەمبەر هاتووە ویستی بێتە دواوە، بەڵام پێغەمبەری خۆشەویستمان بە دەستی ئاماژەی بۆ کرد کە بەردەوام بێت لە نوێژەکەی.

دواتر بەوانەی تەنیشتی فەرموو:

– لەتەنیشتی ئەبوبەکرەوە دامبنێن.

نەخۆشییەکەی سەروەرمان سەختتر بوو. کۆیلەکانی ئازادکرد و شەش یان حەوت دینار خێری بەخشی. وەك ئەوەی بیەوێت هەموو شتەکانی ببەخشێتەوە، ئەو چەکانەشی کە هەیبوون لەناو موسڵمانان‌دا دابەشی کردن. لە ماڵی دنیا چی هەبوو دەیبەخشی. ئامانجی ئەوەبوو چۆن هاتووەتە دنیاوە ئاواش بگەڕێتەوە. لە ماڵەکەیدا هیچ خواردنێك نەمابوو، لەبەرئەوە پێغەمبەرمان قەڵغانەکەی بەرامبەر بە بڕێك جۆ لای دراوسێیەکی یەهودی وەك ڕەهن دانابوو. بۆ نوێژی بەیانی حەزرەتی بیلال بانگی فەرموو. هاوەڵان لەدوای حەزرەتی ئەبوبەکرەوە نوێژیان دەکرد. پێغەمبەری ئازیزمان پەردەی دەرگای مزگەوتی لاداو بۆ کۆتاجار بە چاوی دنیا سەیری هاوەڵانی کرد و زەردەخەنەیەکی شیرین لە ڕخساری پیرۆزیدا دەرکەوت، چونکە لەدوای خۆی ئوممەتێك بەجێدەهێڵێت بەندایەتی و پەرستشی سەرشانیان بەجێدەهێنن. حەزرەتی ئەبوبەکر هەستی بە هاتنی پێغەمبەری خۆشەویستمان کرد و ویستی بێتە دواوە.

بەڵام پێغەمبەری ئازیزمان بە دەستی ئاماژەی بۆ کرد و فەرمووی:

– لە جێگەی خۆتان بوەستن و نوێژەکەتان تەواو بکەن.

دوای ئەوە بە دڵخۆشییەوە پەردەکەی دادایەوە و ڕۆشتەوە ژوورەکەی دایە عائیشە.

بۆ ساتێك پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) ڕوویکردە دایە عائیشە و پاشان فەرمووی:

– ئەی عائیشە چیت لە ئاڵتوونەکان کردووە؟

دایە عائیشەش خێرا ڕۆیشت و ئەو ئاڵتوونانەی کە پێغەمبەرمان مەبەستی بوو هێنای.

پێغەمبەریشمان خستیە نێو دەستی و دەستیکرد بە ژماردنیان:

.... پێنج، شەش، حەوت. بەدەم ژماردنەوە فەرمووی:

– لەکاتێکدا ئەم ئاڵتوونانەت لایە، محمد (دروودی خوای لێبێت) چۆن بتوانێت بچێتەوە خزمەتی خوا؟ ئەمانە هەڵبگرە و خێرا هەمووی ببەخشە.

پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لێبێت) لە کۆتا ساتەکانی ژیانیدا بوو، سەری پیرۆزی نابوو بە سنگی دایە عائیشەوە و

چاوە ڕەشەکانی بۆ سەرەوەیان دەڕوانی. لەم کاتەدا عەبدوڕڕەحمانی برای دایە عائیشە هاتە ژوورەوە. چاوی پێغەمبەری خۆشەویستمان لەسەر سیواکەکەی دەستی عەبدوڕڕەحمان بوو.

دایە عائیشەمان کە ئەمەی بینی پرسی:

– ئەوەت بۆ بێنم؟

پێغەمبەری ئازیز سەری ڕاوەشاند و بە ئاماژە فەرمووی "بەڵێ".

دایە عائیشەش یەکسەر سیواکەکەی لە براکەی وەرگرت و دای بە ئازیزمان.

بەڵام سیواکەکە زۆر ڕەق بوو، بۆیە دایە عائیشەمان پرسی:

– سیواکەکەت بۆ تەڕ بکەم؟

پێغەمبەری خۆشەویست دووبارە سەری ڕاوەشاند و بە ئاماژە فەرمووی بەڵێ.

دایە عائیشە یەکسەر سیواکەکەی هەڵگرت و تەڕی کرد.

پاشان پێغەمبەرمان سیواکەکەی لە دایە عائیشەمان وەرگرت و بە وریاییەوە ددانەکانی پێ پاککردەوە.

سوڵتانی پێغەمبەران لە کۆتا ساتەکانی ژیانی دنیادا بوو.

کاتێك دایە عائیشەمان گوێی لە پێغەمبەری خۆشەویستمان نزیککردەوە، گوێبیستی ئەم نزایە بوو:

– وەك چۆن پێغەمبەران و شەهیدان و چاکەکارانت بە نیعمەتەکانت سەرفراز کردووە، لە منیش خۆشببە و میهرەبانیی خۆت بڕژێنە بە سەرمدا. خوایەگیان دۆستایەتی تۆم دەوێت، خوایەگیان دۆستایەتیی تۆم دەوێت، خوایەگیان دۆستایەتیی تۆم دەوێت.

ئەم نزایەی پێغەمبەری خۆشەویست ناخی دایە عائیشەی وەك ئاگردان هەڵگیرساند و وتی:

''ئیتر لەگەڵ ئێمە نامێنێتەوە.''

دایە عائیشە ئیدی تەنها چارەی خۆی لە نزاکردندا دەبینییەوە. بۆیە دەستی پێغەمبەرمانی بە دەستی خۆیەوە گرت و کەوتە

نزاکردن، بەڵام لەوکاتەدا شتێکی چاوەڕواننەکراو ڕوویدا. دەستی پیرۆزی پێغەمبەری خۆشەویستمان لە دەستی دایە عائیشەمان بەربوویەوە و کەوتە ناو کاسە ئاوەکەی تەنیشتی. لەوکاتەدا دایکمان هەستی کرد پارچەیەك لە ناخی لێبووەتەوە، چونکە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) لە ئەو جیابوویەوە و بە دیداری دۆستە مەزنەکەی شادبوویەوە.

دایکمان نەیدەتوانی ڕێ لەو نرکەوناڵەیە بگرێت کە چەندین ڕۆژە لە قوڕگیدا پەنگی خواردبوویەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو هاوسەری پێغەمبەرمان بوو، بۆیە لە جێی دایکی هەموو ئیمانداران بوو. لەبەرئەوە پێویست بوو زۆر بەهێز و خۆڕاگر بێت، ئەویش داخوازی ئەمەی بەجێگەیاند، سەرەتا سەرینێکی خستە ژێر سەری موبارەکی پێغەمبەرەوە و پاشان بانگی لە خەڵکی کرد و هەواڵە دڵتەزێنەکەی پێدان.

# دایە عائیشە و زانست

حەزرەتی عائیشەی دایکمان (ڕەزای خوای لێبێت) بە سوود وەرگرتن لەوەی لە خزمەتی ئازیزماندا دەژیا، لەڕووی زانستی شەرعییەوە خۆی زۆر باش پێگەیاند. زیرەکی و لێهاتوویی و ئەو تامەزرۆییەی بۆ زانست هەیبوو وایکرد ببێت بە یەکێك لە پێشەواکانی هاوەڵان. ئەو هەر پرسیارێکی بۆ دروست ببوایە لە پێغەمبەری خۆشەویستمانی دەکرد، زۆر بابەت هەبوون کە بەهۆی پرسیارەکانی ئەوەوە ڕۆشن دەبوونەوە و وەڵامەکەی دەزانرا. هەربۆیە دوای کۆچی دوایی خۆشەویستمان هەمووان لە بچووك و گەورە و ئافرەت و پیاو دەهاتن بۆ ماڵەکەی و پرسیاریان لێدەکرد و بەمەش ماڵەکەی وەك خانەیەکی زانست و عیرفانی لێهاتبوو.

ڕۆژێك دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەرمان پرسیاری لێکرا.

دایە عائیشەش وەڵامی ئەم پرسیارەی بەمشێوەیە دایەوە و وتی:

- ئایا ئێوە قورئانی پیرۆز ناخوێننەوە؟ ڕەوشتی پێغەمبەرمان قورئانی بوو.

دووبارە لە دایە عائیشەیان پرسی:

باسی چۆنێتیی نوێژی شەونوێژی پێغەمبەرمان بۆ بکە.

دایە عائیشەش بە پرسیارێك وەڵامی دانەوە و، وتی:

- مەگەر ئێوە سورەتی "المزمل" ناخوێننەوە؟

شێوازی شەونوێژی ئەو وەك ئەوشێوەیە بوو کە لەو سورەتەدا باسکراوە. ئەمانە و چەندین بابەت و زانیاریی تر دەربارەی ئایینە پیرۆزەکەمان لە ڕێی دایە عائیشەوە بەدەست ئێمە گەشتووە.

# کۆچی دوایی

## دایە عائیشە

دایە عائیشەمان (ڕەزای خوای لێبێت) دوای کۆچی دوایی پێغەمبەرمان ساڵانێکی زۆر ژیا. لەم سەردەمەی ژیانیدا هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ ئەوەی ئایینی ئیسلام بەشێوەیەکی دروست بەخەڵکی بگەیەنرێت، لە سەروبەندی بەجێگەیاندنی ئەم فەرمان بەرییەدا و لە ڕۆژێکی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا بەرەو لای پەروەردگاری گەڕایەوە. یەکێك لە هاوەڵە نزیکەکانی پێغەمبەری خوا کە ئەبوهورەیرە بوو (ڕەزای خوای لێبێت) نوێژی جەنازەی لەسەر کرد. لە مەراسیمی بەخاکسپاردنیدا خەڵکێکی زۆر ئامادە بوون، ئەوانەی بیستبوویان حەزرەتی عائیشە کۆچی دوایی کردووە، بە خێرایی

خۆیان گەیاندبوویە مەراسیمەکە، چونکە حەزرەتی عائیشە هەم خێزانی خۆشەویستی پێغەمبەرمان و هەم دایکی هەموو ئیماندارانە هەتا ڕۆژی دوایی.

خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی مامەڵەی لەگەڵ بکات و ئێمەش بخاتە بەر شەفاعەتیان. (ئامین)

پێغەمبەری خۆشەویستیشمان دایە عائیشەی زۆر خۆشدەویست. ئەو هاوەڵانەی کە ئەم خۆشەویستییەی پێغەمبەریان دەبینی بۆ دایە عائیشە بە "خۆشەویستەکەی پێغەمبەر" بانگی دایە عائیشەیان دەکرد.

کاتێك هاوەڵان دیارییان دەهێنا بۆ پێغەمبەری خۆشەویستمان ئەو کاتانەیان هەڵدەبژارد کە پێغەمبەر لەماڵەکەی حەزرەتی عائیشە بوو، چونکە کاتێك لای دایە عائیشە بوو ڕوخساری وەك گوڵ دەدرەوشایەوە.

حەزرەتی عائیشەش هەستی بەم خۆشەویستینەی پێغەمبەر کردبوو بەرامبەری. کاتێك لە پێغەمبەری خۆشەویستیان دەپرسی ''کێت لە هەمووان زیاتر خۆشدەوێت؟'' دەیفەرموو ''عائیشە.''

دەیانپرسی ''لە پیاواندا کێت لە هەمووان زیاتر خۆشدەوێت؟'' دەیفەرموو ''باوکی عائیشە.''